# 10 کورتە چیرۆکی ئینگلیزی

وەرگێرانی

محمد موسا ابراهیم

چاپی یەکەم

2013

# ١٠

# کورتە چیرۆکی ئینگلیزی

# *10*
# *English short Stories*

وەرگێڕانی:

محەمەد موسا ئیبراهیم

ناوی کتێب: ١٠ کورتە چیرۆکی ئینگلیزی

بابەت: چیرۆك

وەرگێڕ: محەمەد موسا ئیبراهیم

دیزاین: هەڵوێست عبدالله زادە

بەرگ: هیوا

پێداچوونەوەی دەق: ئیسماعیل عبدالرحمن پیرداودیی

تایپ: دایکی هدی و زینب موسی ئیبراهیم

چاپخانە: هیڤی

تیراژ: ١٠٠٠ دانە

چاپی: یەکەم

لە بەڕێوەبەرایەتی گشتی کتێبخانە گشتییەکان

ژمارەی سپاردنی (٧٦٢)ی ساڵی ( ٢٠١٣ ) ی پێدراوە.

# کاسەیەکی دارین

پیرە پیاوێکی لەڕوو لاواز ڕۆیشت بۆئەوەی لەگەڵ کوڕ و بووك و کوڕەزا چوارساڵانەکەی بژیت. دەستەکانی پیرە پیاوەکە دەلەرزی و سۆمای بینینی لێڵ ببوو و هەنگاوەکانی پەرش و بڵاوەبوون. خێزانەکە شەوانە لەسەر مێزی نانی ئێوارێیان بەیەکەوە دەخوارد. بەڵام دەستە لەرزۆکەکانی باپیرێی بەساڵاچوو و بینایییە لاوازەکەی خواردنەکەیانی ئەستەم کردبوو. دەنکە پاقلەکان لە کەوچکەکەی دەکەوتنە سەر زەوی. کاتێ ئەو بەرداغی دەگرت جارجار شیر دەڕژا سەرچەفی مێزی نان خواردن. کوڕ و بووکەکە بە پیسی یەکە بێزاربوون.

کوڕەکە ووتی:" ئێمە پێویستە شتێ لەبارەی باپیرە بکەین. بێزارم لە شیرە ڕژاوەکەی و لەنان خواردنە بە دەنگە دەنگەکەی و کەوتنی خۆراك لەسەر زەوی. بۆیە مێرد و ژنەکە مێزێکی بچووکیان لە سوچێکدا دانا. لەوێیووە، باپیرە بە تەنیا خواردنی دەخوارد لە کاتێکدا تەواوی خێزانەکە کاتێکی خۆشیان لە خواردنی نانی ئێوارێیان لەسەر مێزی نان خواردنی ئیوارێ بەسەر دەبرد. چونکە باپیرە قاپێ یا دووانی شکاوی هەبوو، خواردنی لە کاسەیەکی دارین بۆ تێدەکرا. هەندێ جار کە خێزانەکە تەماشای لای باپیرەیان دەکرد، ئەو فرمێسکی لە چاو بوو کە خواردنی بە تەنیا دەخوارد. هێشتا، ژن و مێردەکە تاکە وشەکانیان بۆ باپیرە سەرزەنشتکردنی ڕەقبوون. کاتێ ئەو چەنگاڵێکی بەردەدایەوە یاخود خواردنی دەڕشت. کوڕە تەمەن چوار ساڵانەکە بەبێ دەنگیەوە تەماشای ئەو دیمەنەی دەکرد.



# The Wooden Bowl

A frail old man went to live with his son, daughter-in-law, and a four-year old grandson. The old man's hands trembled, his eyesight was blurred, and his step faltered. The family ate together nightly at the dinner table. But the elderly grandfather's shaky hands and failing sight made eating rather difficult. Peas rolled off his spoon onto the floor. When he grasped the glass often milk spilled on the tablecloth. The son and daughter-in-law became irritated with the mess. "We must do something about grandfather," said the son. I've had enough of his spilled milk, noisy eating, and food on the floor. So the husband and wife set a small table in the corner. There, grandfather ate alone while the rest of the family enjoyed dinner at the dinner table. Since grandfather had broken a dish or two, his food was served in a wooden bowl. Sometimes when the family glanced in grandfather's direction, he had a tear in his eye as he ate alone. Still, their only words the couple had for him were sharp admonitions when he dropped a fork or spilled food. The four-year-old watched it all in silence.

ئێوارەیەکیان پێش نانی ئێواریّ، باوکەکە کوڕەکەی بینی یاری بە پاشماوەی دارەکانی سەر زەوی دەکرد. ئەو بە نەرمی پرسیاری لە منداڵەکە کرد، :" ئایا تۆ چی دروست دەکەیت؟" هەر بە نەرمییەوە، کوڕەکە وەڵامی دایەوە

" ئۆۆ،" من قاپێکی بچووک بۆ تۆ و دایە دروست دەکەم کاتیّ من گەورە دەبم خواردنەکەتان تێدا بخۆن.

" منداڵە تەمەن چوار ساڵەکە زەردەخەنەیەکی کرد و گەڕایەوە بۆ سەر ئیشکردن. قسەکە دایك و باوکەکەی ڕاچلەکاندا کە ئەوان لاڵ بوون. جا فرمێسکەکان بەسەر ڕوومتیاندا هاتە خوارەوە. سەرەڕای هیچ ووشەیەك نەووترا، هەردووکیان زانییان پێویستە چی ئەنجام بدەن. ئەو ئێوارەیە مێردەکە دەستی باپیرەیی گرت و ڕێدا بە نەرمییەوە بۆ سەر مێزی خێزانی بگەڕێتەوە.

ئەوەندەی تەمەنی مابوو، ئەو هەموو ژەمێکی لەگەڵ خێزانەکەدا خوارد. و بۆ چەند هۆکارێك، نە مێرد و نە ژنەکەش وا دیار نەبوون چی تر گرنگییان بدەن کاتیّ چەنگاڵێك بەردەبۆوە و شیر ڕشان یاخود سەر چەفی مێزەکە پیس ببێت. ***منداڵان زۆر ووردبینن. چاوەکانیان هەمیشە سەرنج دەدەن گوێیەکانیان هەمیشە گویّ دەگرن و مێشکیان هەمیشە دەرئەنجامی پەیامەکان لێکدەدەنەوە کە وەریان دەگرن. ئەگەر ئێمەیان بە ئارامیەوە بینی کە کەشێکی دڵخۆش بۆ ئەندامانی خێزانەکە لە ماڵەوە دابین دەکەین، ئەوان لاسایی ئەو هەڵویستە بۆ تەواوی ژیانیان دەکەنەوە. دایك و باوکی ژیر دەرك دەکەن کە هەموو ڕۆژیّ بلۆکەکانی بینایەی داهاتووی منداڵەکەیان دادەنرێت.***

***با ئێمە هەموومان ببین بە بیناسازی هۆشیار و ڕۆڵی نمونەیی بگێڕن. ئاگاداری خۆت و ئەوانەش بە کە خۆشت دەوێن ئەمڕۆ و هەموو ڕۆژیّ.***

One evening before supper, the father noticed his son playing with wood scraps on the floor. He asked the child sweetly, "What are you making?" Just as sweetly, the boy responded, "Oh, I am making a little bowl for you and mama to eat your food from when I grow up." The four-year-old smiled and went back to work. The words so struck the parents that they were speechless. Then tears started to stream down their cheeks. Though no word was spoken, both knew what must be done. That evening the husband took grandfather's hand and gently led him back to the family table.

For the remainder of his days he ate every meal with the family. And for some reason, neither husband nor wife seemed to care any longer when a fork was dropped, milk spilled, or the tablecloth soiled.

Children are remarkably perceptive. Their eyes ever observe, their ears ever listen, and their minds ever process the messages they absorb. If they see us patiently provide a happy home atmosphere for family members, they will imitate that attitude for the rest of their lives. The wise parent realizes that every day that building blocks are being laid for the child's future.

Let us all be wise builders and role models. Take care of yourself, and those you love, today, and every day!

# ئەستێرەی دەریا

كاتێك بە كەنار دەریایەكدا دەڕۆیشتم، پیاوێكم بینی چەند هەنگاوێك لە پێش مندا دەڕۆیشت. هەرچەند خوولەكێكی كەم، ئەو دەچەمایەوە و شتێكی لە كەنار دەریاوە هەڵدەگرتەوە و فڕێیدەدایەوە ناو دەریاكەوە. سەیرە، من پرسیارم لێكرد ئەو چی دەكات.

ئەو وەڵامی دایەوە: " ئەستێرەی دەریا،" ئەوان بە هۆی هەڵكشانی كەنار بۆ سەر دەریا ڕادەماڵدرێن. ئەگەر فڕێیان نەدەمەوە، ئەوان بە هۆی تیشكی گەرمی ڕۆژەوە سووردەبنەوە و دەمرن."

من ووتم:" ئایا تۆ شێتی؟" هەزارەها كەنار دەریا لە دەوری جیهاندا هەن و ملیۆنەها ئەستێرەی دەریا لە دەوریاندا دەمرن. ئایا چ جیاوازیەك دروست دەكات؟" ئەو ووتی:" باشە، لەو كاتەدا یەكێكی تری فڕێیدایەوە ناو دەریاكەوە

***"بۆ ئەمەیان جیاوازی دروست دەكات."***

# Starfish

Walking along seashore, I saw a man walking a few paces ahead of me. Every few
minutes, he would bend down, pick up something from the beach and throw it back into the sea.
Curious, I asked him what he is doing.
"Starfish", he replied, "They are washed ashore by the tide. If I don't throw them
back, they will be baked and dead by the sun."
"Are you crazy?" I said, "There are thousands of beaches around the world and
millions of starfishes dying around. What difference does it make?"
"Well," said he, as he hurled another one into sea, "It does make a difference to this one."

# کوڕێک و پیرە پیاوێک

کورێك كەوتە نـاو ڕووبارێکـەوە و خـەریك بـوو دەخنکا. پیاوێك، لـەوێ تێپەڕدەبوو، گوێی لەگریان و هاواری یارمەتی دان بوو و خـۆی فرێدایـە ناو ڕووبارەکەوە، کوڕەکەی هێناوە کەنار ڕووبارەکەوە.

کوڕەکە ووتی:" مامە نازانم چۆن بتوانم بە تەواوی سوپاست بکەم."

پیاوەکە وەڵامی دایەوە: " کوڕم تۆ دەتوانی سوپاسم بکەی...،" بـە دڵنییابون لەوەی کاتێ تۆ گەورە دەبیت، پەشیمان نەبمەوە لەوەی کە تۆم ڕزگارکردووە."

# A boy and an Old Man

A boy fell into the river and began to drown. A man, who was passing by, heard his
cries for help and jumping into the river, brought the boy back to shore.
"I don't know how I can thank you enough, uncle" said the boy.
"You can thank me son…," replied the guy, "…by making sure that when you grow up, I will not regret saving you."

# سەربازێكی نەخوێندەوار

پیاوێكی نەخوێندەوار و گێل پەیوەندی بەسەنتەری سەربازگەیەكی نوێی سوپا كرد. ئەو چەند مانگێك لە كۆرسی مەشقی سەربازیی ناخۆشی چێژت كە وای لێ بكات شایەنی پەیوەندی كردنی بەسوپاوە بێت.

بەداخەوە، هەر دوای تەواوبوونی هەفتەیەكی ئەم مەشقە، هەواڵ گەیشت كە ئەفسەرێكی سوپا سەردانێك دەكات كە چاوپێكەوتن لەگەڵ پاڵێوراوەكان ئەنجامی دەدات و لە جۆری مەشقەكە دەكۆڵێتەوە لەلایەن مەڵبەندی ناوەندەكە دەدرێت. ئەو كەسەی بەرپرسی مەشقی ئەو پاڵێوراوانە بوو زۆر نیگەرانی سەربازە تازە دامەزراوە گێلەكە بوو. هەرچەندە، لەمەوپێش ئەفسەرێكی شارەزای سوپا هەرژمار دەكرا، ئەو جۆری پرسیارەكانی بەباشی دەزانی كە لە سەربازە نوێیەكان دەكرێت. بۆیە ئەو ڕاهێنانی بەتەواوی بەم پیاوە كرد تاوەكو بەڕاستی و تێرو تەسەلی وەڵامی پرسیارە چاوەڕوانكراوەكان بداتەوە.

ئەو پێش هەموو شتێك داوای لێكرد زنجیرەی پرسیارەكانی لەیاد بێت. یەكەمینی پرسیار ئەوە دەبێت" تەمەنت چەندە؟" تۆ دەڵێت" بیست و دوو ساڵ. " دووەمین پرسیار ئەوە دەبێت." ئایا بۆ ماوەی چەند دەبێت لەم سەنتەرەیی؟"

تۆ وەڵام دەدەیتەوە." دوو ساڵ." سێیەمین پرسیار لەوانەیە ئەوها بێت. "ئایا تۆ لەم سەنتەرە دڵخۆشی یاخود غەریبی ماڵەوە دەكەیت؟" پێویستە تۆ بڵێیت" لە هەردووكیان لێرە و لە شوێنەكەم واهەست دەكەم لەماڵەوەم."

# An Uneducated Soldier

An uneducated and simple minded person joined a military recruiting centre. He was undergoing a few months' training course which would make him eligible to join the army. Unfortunately, just after completing a week of this training, news reached that there would be a visit of an army officer who would interview the candidates and inspect the type of training being given by the centre.
The person in charge of training these candidates was very much worried about the newly recruited simple minded man. However, since he was counted to be an experienced army officer, he knew well the type of questions that would be put to the new recruits. So, he coached this man thoroughly to answer correctly plausible questions. He asked him to first of all remember the sequence of the questions. The first question would be 'What is your age?' You are to say "22 years". The second question would be 'How long have you been in this center?' You are to answer "two years". And the third may be, 'Are you happy in this center or do you feel homesick?' You have to say "I am feeling at home both here and in my place."

قوتابیەكە ئەو وەڵامانـەی بـەدەرخ لەبـەركرد. لـە ڕۆژی لێكۆڵینـەوەدا، ئەو بۆ ژووری چاوپێكەوتن داوای لێكرا بێت. ئەفسـەری لێكۆڵینـەوە پرسـیاری لێكـرد " ئایـا بـۆ مـاوەی چـەند لێـرەی؟" قوتابیەكـە تـەنها زنجـیرەی پرسـیارەكانی لـەیاد دەبێـت" بیسـت و دوو سـاڵ." بـەڵكو ئەفسەرەكە سەرسام بوو. پاشان ئەو پرسیاری لێكرد، "ئایـا تەمـەنت چـەندە؟" قوتابیەكـە وتـی" دوو سـاڵە." "ئەمـە چ قسـەیەكی بـێ مانایە؟" ئەفسـەرەكە نەڕانـدی" ئایا تـۆ شـێتیت یـاخود مـن شـێتم." قوتابیەكە لەسەرخۆوە وەڵامـی دایـەوە، "هـەردووكمان." چـونكە ئـەو تەنها توانی ئەو ووشەیەی لەیاد بێت لەبەر ئەوە سەربازەكە زۆر ترسا.

***ئەوە زۆر ترسناكە گەر تۆ شتەكانت تەنها بەدەرخ لەیاد بمینێتەوە***

The Cadet learnt these answers by rote. On the day of inspection, he was asked to come to the interview room. The inspecting officer asked him, "How long have you been here"? The cadet just remembering the sequence of the questions said, "22 years". The officer was rather surprised. Then he asked, "What is your age"? The cadet said, "Two years". "What nonsense is this? Are you mad or am I mad", roared the officer. The cadet calmly answered, "Both" as he could only remember that word that's why he was scared.

It is dangerous if you remember things by rote

## رێگا بەرەو بەهەشت

پاش هەموو نیوەڕۆیەكی ڕۆژی هەینی، دوای نوێژی جومعە، ئیمام و كوڕە تەمەن یانزە ساڵەكەی بۆ دەرەوەی شار دەڕۆیشتن و **نامیلكەی" ڕێگای بەرەو بەهەشت"** و **ئەدەبی ئیسلامی** تریان دابەش دەكرد. كاتی ئەوە بۆ ئیمام و كوڕە تەمەنی یانزە ساڵەكە هات بۆ ئەوەی بە نامیلكەكەیانەوە بەرەو شەقامەكان بلاوەبكەن، دەرەوە زۆر سارد بوو، بارانیش بەخوڕ دەهاتە خوارەوە. كوڕەكە بە گەرمترین و وشكترین جل و بەرگ خۆی پێچایەوە و ووتی، " باشە باوكە، ئامادەم! "

باوكەكە پرسیاری كرد،" بۆچی ئامادەیی،"

"باوكە، كاتی ئەوە هاتووە بچینە دەرەوە و ئەم پەرتووكە ئیسلامیانەش دابەشبكەین. باوكەكە وەلامی دەداتەوە،" كوڕم دەرەوە زۆر ساردە و بارانیش بەخوڕ دەبارێت."

كوڕەكە بەسەر سوڕمانەوە سەیری باوكی دەكات، "دەپرسێت، بەلام باوكە ئایا تا ئێستاش خەڵكی ناچنە جەهەننەم هەرچەندە بارانیش دەبارێت؟"

باوكەكە وەلامی دەداتەوە،" كوڕم لەم كەشەدا ناچمە دەرەوە." بە نائومێدیەوە، كوڕەكە دەپرسێت "باوكە تكایە دەتوانم بچمە دەرەوە؟"

باوكی بۆ ساتێك دوو دڵ بوو پاشان ووتی، كوڕم دەتوانی بڕۆیت ها ئەوەتا نامیلكەكان. كوڕم ئاگاداربە."

سوپاس، باوكە! "

# Path to Paradise

Every Friday afternoon, after the Juma prayers, the Imam and his eleven year old son would go out into their town and hand out "the booklet of **PATH TO PARADISE and other Islamic literature**.
As the time came for the Imam and his son to go to the streets with their booklets, it was very cold outside, as well as pouring rain.
The boy bundled up in his warmest and driest clothes and said, 'OK dad, I'm ready!'
His dad asked, 'Ready for what' 'Dad, it's time we go out and distribute these Islamic books.' Dad responds, 'Son, it's very cold outside and it's pouring rain.'
The boy gives his dad a surprised look, asking, 'But Dad, aren't people still going to hell, even though it's raining?'
Dad answers, 'Son, I am not going out in this weather.' Despondently, the boy asks, 'Dad, can I go please?' His father hesitated for a moment then said, 'Son, you can go. Here are the booklets. Be careful son.'
'Thanks, Dad

لەگەڵ ئـەوەدا، ئـەو شـوێنەکەی جـێ هێشـت و لەبـەر بارانـەوە چـووە دەرەوە. ئەم کـوڕە تەمـەن پـانزە سـاڵەیە ڕۆیشـت بـەرەو خـوارەوەی شـەقامەکانی شـارەکە دەرگـا بـە دەرگـا دەچـوو و ئـەو هـەرکێ لـە شـەقامێکدا چـاوی پێکـەوت نامیلکەیـەك یـاخود پـەرتووکێکی بچـوکی دەدایێ.

دوای دووکاتژمێر لەبەر باران ڕۆیشتن، ئەو تەڕببوو، ئێسکی مووچڕکی تەڕببوون و بۆ دواهەمین نامیلکە ڕۆیشتە خـوارەوە. ئـەو لـە سوچـێکدا ڕاوەستا سـەیری یـەکێکی دەکـرد تـاوەکو نامیلکەیـەکی بـداتێ، بـەڵام شەقامەکان بەتەواوی چۆل ببـوون. پاشـان ئـەو بـەرەو یەکـەمین مـاڵ سوڕایەوە کە پێینایە سەر شۆستەکە و بەرەو دەرگای پێشەوە ڕۆیشت و لە زەنگی دەرگای دا. ئەو زەنگی لێدا، بەڵام کەس وەڵامی نەدایەوە. ئـەو دوبـارە و دوبـارە زەنگـی لێـدا، بـەڵام هێشـتا هـیچ کـەس وەڵامـی نەدایـەوە. ئـەو چـاوەڕێی کـرد بـەڵام هێشـتا هـیچ وەڵامێـك نـەبوو. لـە کۆتاییدا، ئەو سوڕایەوە تاوەکو بڕوات، شتێ ئەوی ڕاگرت. جارێکی تر، ئەو بـۆلای دەرگاکـە سـوڕایەوە و زەنگـی لێـدا و بەمسـتی قایمـەوە لـە دەرگاکەی دا. ئـەو چـاوەڕێی کـرد، شـتێ لـە هـەیوانی پێشـەوە ئـەوی ڕاگرت. ئەو دوبارە زەنگی لێدایـەوە و ئـەم جـارە دەرگاکـە بەهێواشـی بۆوە.

لە شوێنی چوونە ژوورەوەی دەرگـا خـانمێکی بەسـاڵا چـووی خـەمبار، وەستا بوو. ئەو بەنەرمی پرسیاری کرد.

" فەرموو کوڕم؟"

And with that, he was off and out into the rain. This eleven year old boy walked down to the streets of the town going door to door and handing everybody he met in the street a pamphlet or a booklet.
After two hours of walking in the rain, he was soaking, bone-chilled wet and down to his VERY LAST BOOKLET.
He stopped on a corner and looked for someone to hand a booklet to, but the streets were totally deserted.
Then he turned toward the first home he saw and started up the Side walk to the front door and rang the doorbell. He rang the bell, but nobody answered..
He rang it again and again, but still no one answered. He waited but still no answer.
Finally, he turned to leave, but something stopped him. Again, he turned to the door and rang the bell and knocked loudly on the door with his fist. He waited, something holding him there on the front porch! He rang again and this time the door slowly opened.
Standing in the doorway was a very sad-looking elderly lady. She softly asked, 'What can I do for you, son?

بەچـاوانی گەشـەوە و زەردەخەنەیـەك، کـە جیهـانی ئـەوی روونـاك کردەوە،

" ئـەم کـوڕە بچـووکە ووتـی"، خـانم، داوای لێبـوردن دەکـەم، ئەگـەر بێزارم کردبی، بـەلاّم بەتـەواوی دەمـەوێ پێت بڵێم کـە خـوای گـەورە بەڕاستی تۆی خۆش دەوێت و چاودێریت دەکات و من هـاتووم تـاوەکو دواهەمین نامیلکەت بدەمێ کە لەبارەی خـوای گـەورە هـەموو شـتێکت پێ دەڵێت، ئامانجی راستەقینەی دروست بـوون و چۆنیەتی بەدەسـت هێنانی ڕەزامەندی ئەو."

لەگەڵ ئەوە ئـەو دواهـەمین نامیلکـەی دایێ و سـوڕایەوە تـاکو بـڕوات. ژنەکە بانگی کوڕەکەی کرد کاتێ ئەو ڕۆیشت.

سوپاس، کوڕم! و خوای گەورە بتپارێزی!"

هەفتەی داهاتوو لە پاش نیـوەڕۆی ڕۆژی هـەینی دوای نوێـژی جومعـە، ئیمامەکـە هەنـدێ وانـەی پێشـکەش دەکـرد. هەرکـە ئـەو کۆتـایی بـە وانـەکانی دەهێنـی، ئـەو پرسـیاری کـرد، ئایـا کەسـێ پرسـیاری هەیـە یاخود دەیەوێ شتێ بڵێت؟" بەهێواشیەوە لە دواوەی ریزی خانمەکان، خانمێکی بە سالاّچوو، دەنگی بەسەر سەماعەکەوە بیسترا.

هـیچ کـەس لـەم کۆبوونەوەیـەدا مـن ناناسـێت. هـەرگیز پێشـتر لێـرە نەبوومە. دەزانی، پێش هەفتەی ڕابردوو من موسڵمان نەبووم و بیریشم لێ نەکردبۆوە ببم بە موسڵمان. مێردەکەم پێش چەند سـاڵێك بـەر لـە ئێستا مرد و لەم جیهاندا منی بە تەنیا جێهێشت... هەفتـەی ڕابـردوو، ڕۆژێکی بەتایبـەتی سـاردو و بارانـاوی بـوو، بەتـەمای خۆکوشـتن بـووم چونکە من هیچ ئاواتێکم نەمابوو.

بۆیـە کورسـی یـەك و گوریسـێکم هێنـا و بەسـەر پەیـژەی بنمەچـی ماڵەکەم کەوتم. بەدڵنیاییەوە کورسیەکەم، لەستونی سـەربانەکە قـایم کـرد و پاشـان لـە سـەر کورسـی یەکـەوە وەسـتام و سـەرەکەی تـری گوریسەکە لە دەوری ملم قایم کرد.

'With radiant eyes and a smile that lit up her world, this little boy said, 'Ma'am, I'm sorry if I disturbed you, but I just want to tell you that ALLAH REALLY LOVES AND CARES FOR YOU and I came to give you my very last booklet which will tell you all about God, the real purpose of creation, and how to achieve His pleasure.'

With that, he handed her his last booklet and turned to leave. The woman

called the boy as he departed. 'Thank you, son! And God Bless You!'

Next week on Friday afternoon after Juma prayers, the Imam was giving some lectures. As he concludes the lectures, he asked, 'Does anybody have questions or want to say anything?' Slowly, in the back row among the ladies, an elderly lady's voice was heard over the speaker.

'No one in this gathering knows me. I've never been here before. You see, before last Friday I was not a Muslim, and thought I could be.

My husband died few years ago, leaving me totally alone in this world..

Last Friday, being a particularly cold and rainy day, I was contemplating suicide as I had no hope left. So I took a rope and a chair and ascended the stairway into the attic of my home.. I fastened the rope securely to a rafter in the roof then stood on the chair and fastened the other end of the rope around my neck.

کاتێك لەسەر کورسیەکەوە وەستا بووم، زۆر بەتەنیایی و دڵشکاوی خەریك بوو پازبدەم، کاتێ لەناکاو زەنگە لێدانە بەرزەکەی زەنگی دەرگای ئەهۆمی خوارەوەم منی راچڵەکاند.

بیرم کرد، بۆ ساتێ چاوەرێی دەکەم و هەرکێیەك بێت دەڕوات.

چاوەڕێم کرد و چاوەڕێم کرد ، بەلاّم زەنگی لێدانی زەنگی دەرگاکە وا دیاربوو بەرزتر و سوورتر دەبوو و پاشان کەسە زەنگ لێدەرەکە دەستیشی بە دەرگا لێدانی قایم کرد. جارێکی بۆ خۆم بیرم کردەوە. "دەبێت ئەوە کێ بێت؟"

هەرگیز کەس زەنگەکەمی لێنەداوە وە نەهاتووە بمبینێت." کورسی گەردەنم شلکردەوە بۆ دەرگای پێشەوە چووم، بە درێژایی ئەو کاتە زەنگەکە بەرزتر و بەرزتر لێیدا.

کاتێ دەرگاکەم کردەوە و لە هەیوانی پێشەوەیی ماڵەکەم ڕووخۆشترین و کوڕێکی فریشتە ئاسام بینی بە حاڵێ بروام بە چاوەکانم دەکرد هەرگیز لە ژیانمدا نەم بینیبوو.

زەردەخەنەکەی، ئۆۆ، هەرگیز ناتوانم وەسفی زەردەخەنەکەی بۆتان بکەم. وشەکان کە لە دەمیەوە دەهاتنە دەرەوە وای لە دڵم کرد بۆ ژیان پازبدات کە لە مێژبوو مردبوو کاتێ وەك دەنگی فریشتە ئاسا وتی، خانم بەتەواویی هاتووم بۆ ئەوەی پێت ***"بڵێم کە خوای گەورە بە ڕاستی تۆی خۆشدەوێ و چاودێریت دەکات!"***

پاشان ئەو ئەم نامیلکەیەی دامێ، ڕێگای بەرەو بەهەشت کە ئێستا من بە دەستمەوەیە.

Standing on that chair, so lonely and broken-hearted. I was about to leap off, when suddenly the loud ringing of my doorbell downstairs startled me.
I thought, I'll wait a minute, and whoever it is will go away.
I waited and waited, but the ringing doorbell seemed to get louder and more insistent, and then the person ringing also started knocking loudly....
I thought to myself again, 'Who on earth could this be?
Nobody ever rings my bell or comes to see me.' I loosened the rope from my neck and started for the front door, all the while the bell rang louder and louder.
When I opened the door and looked I could hardly believe my eyes, for there on my front porch was the most radiant and angelic little boy I had ever seen in my life. His SMILE, oh, I could never describe it to you! The words that came from his mouth caused my heart that had long been dead TO LEAP TO LIFE as he exclaimed with a cherub-like voice, 'Ma'am, I just came to tell you that:
ALLAH REALLY LOVES AND CARES FOR YOU!'
Then he gave me this booklet, Path To Paradise that I now hold in my hand.

هەرکە کوڕە بچووکەکە کە وەك فریشتە ئاسا وا بوو بۆناو سارمە و بارانەکان ڕۆیشتە دەرەوە، دەرگاکەم داخست و لەسەر خۆییەوە هەموو ووشەیەکی ئەم پەرتووکەم خوێندەوە. پاشان چوومە سەرەوە بەرەوە بنمیچی ماڵەکەم بۆ ئەوەی گوریس و کورسییەکەم بهێنم. من چیتر پێویستیم پێیان نی یە. دەبینی؟ ***من ئێستا بەندەیەکی دڵخۆشی خوای گەورەم.***

لەکاتێکدا ناونیشانی جەماعەتی مزگەوتەکەت لە پشتەوەی ئەم ناميلكەيە نيشاندرابوو. من بۆ ئێرە هاتووم تا بە خۆم بڵێم سوپاس بۆ بەندەی خوای گەورە کەوەکو فریشتە ئاسا وابوو کە لەکاتی خۆیدا هات و بە ئەنجامدانی ئەمە، گیانمی لە جەهەننەمی ئەبەدی رزگار کردم.

هیچ چاوێکی وشك لە مزگەوتدا نەمابوو تەنها گریان بوو. هاوارەکانی تەکبیر لێدانی... الله اكبر لە هەوادا بەرزبۆوە. (باوکی-ئیمام) لە مینبەرەکە هاتە خوارەوە بەرەو ڕیزی پێشەوە چوو کە کوڕە بچووکەکەی دانیشتبوو. ئەو کوڕەکەی بە باڵەکانی گرت و بەبێ سنوورەوە دەگریا. لەوانەیە هیچ جومعەیەك ساتێکی ئەوا شکۆداری نەبووبێت و لەوانەیە ئەم گەردوونە هیچ باوکێکی نەبینیبووبێت کە پڕبێت لە خۆشەویستی و ڕێز بۆ کوڕەکەی.

***بێجگە لەمەیان.***

As boy who looked like an angel disappeared back out into the cold and rain, I closed my door and read slowly every word of this book.
Then I went up to my attic to get my rope and chair.
I wouldn't be needing them anymore.
You see? I am now a Happy slave of Allah.
Since the address of your congregation was stamped on the back of this booklet, I have come here to personally say THANK YOU to God's slave who looked like an angel and came just in the nick of time and by so doing, spared my soul from an eternity in hell.'
There was not a dry eye in the mosque except crying.
The shouts of TAKBIR... ALLAH AKBAR... rose in the air.
Imam-Dad descended from the pulpit to the front row where the little
boy was seated....
He took his son in his arms and sobbed uncontrollably.
Probably no Jama'at has had a more glorious moment, and probably this universe has never seen a father that was more filled with love and honor for his son...
Except for One.

# چوار خێزانەكان

جارێـك لـە جـاران بازرگانێـك چـوار خێزانـی هـەبوو. ئـەو خێزانـی چـوارەمینی زۆر خۆشدەویسـت و بـەڕۆبی گرانبـەها ڕازاندبیـەوە و بەناسكی مامەڵەی لەگەڵ دەكرد. ئـەو گرنگیێكـی زۆری پێیـدا و تـەنها باشترین شتیشی پێدەبەخشی. هـەروەها خێزانـی سێیەمینیشـی زۆر خۆشدەویسـت. ئـەو زۆر شـانازی پێـدەكات و هەمیشـە لـە لای برادەرەكـانی هـەڵی دەكێشـا. هـەر چـەندە بازرگانەكـە هەمیشـە لـە ترسێكی گەورە دایە كە ئەو لەوانەیە لەگەڵ پیاوانی تر ڕابكات. خێزانی دووەمینیشی خۆشدەویست. ئەو كەسێكی زۆر بـە هەسـتە و هەمیشـە لەسەرخۆیە و لە ڕاستیدا ئەو باوەڕپێكراوی بازرگانەكەیـە. هـەر كاتێك بازرگانەكە توشی كێشە بوویـا، بازرگانەكـە هەمیشـە ڕووی لـە خێزانـی دووەمینی دەكرد و ئەو هەمیشە لە میانەی كاتە ناخۆشەكاندا یارمـەتی بازرگانەكەی دەدا.

ئیسـتا، خێزانـی یەكـەمینی بازرگانەكـە هاوسـەرێكی زۆر بەوەفایـە و بەشـداریەكی گـەورەی لـە بـەردەوامی سـەروەت و سـامان و ئـیش وكارەكـەی كـردووە و هـەروەها چـاودێری ماڵەوەشـی بـۆ دەكـات. هەرچەندە، بازرگانەكە خێزانی یەكەمینی خـۆش نەویسـت و سـەرەڕای ئـەوەی ئـەو زۆر بازرگانەكـەی خـۆش ویسـت. بازرگانەكـەش زۆر بەدەگمەن گرنگی پێدا.

ڕۆژێك، بازرگانەكە نەخۆش دەكەوێت. پـێش وەختـە، ئـەو دەزانـێ كـە زوو دەمرێت. ئەو بیری لـە ژیانـە زۆر خۆشـەكەی كـردەوە و بـە خـۆی وت: "ئیستا چوار خێزانم هەیە. بـەڵام كـاتێ مـن دەمـرم، مـن بـە تـەنیا دەبم . چەندە بەتەنیا دەبم!"

بەم شێوەیە، ئەو پرسیاری لە خێزانی چوارەمینی كرد

# The Four Wives

Once upon time there was a rich merchant who had 4 wives. He loved the 4th wife the most and adorned her with rich robes and treated her to delicacies. He took great care of her and gave her nothing but the best.

He also loved the 3rd wife very much. He's very proud of her and always wanted to show off her to his friends. However, the merchant is always in great fear that she might run away with some other men.

He too, loved his 2nd wife. She is a very considerate person, always patient and in fact is the merchant's confidante. Whenever the merchant faced some problems, he always turned to his 2nd wife and she would always help him out and tide him through difficult times.

Now, the merchant's 1st wife is a very loyal partner and has made great contributions in maintaining his wealth and business as well as taking care of the household. However, the merchant did not love the first wife and although she loved him deeply, he hardly took notice of her.

One day, the merchant fell ill. Before long, he knew that he was going to die soon. He thought of his luxurious life and told himself, "Now I have 4 wives with me. But when I die, I'll be alone. How lonely I'll be!"

Thus, he asked the 4th wife

" تۆم زۆر خۆش ویست و باشترین پۆشاکم بۆ تەرخان دەکردی و گرنگیێکی زۆرم پێدای. ئیستا وا خەریکە دەمرم، ئایا لەگەڵم دێی و هاورێیەتیم دەکەی؟" خێزانی چوارەمینی وەلآمی دایەوە" مەحاڵە ! " ئەو ڕۆیشت بە بێ ئەوەی ووشەیەکی تر بڵێت.

وەلآمەکە وەکو چەقۆیەکی تیژ بەناو دڵی بازرگانەکە چەقی. بازرگانە خەمبارەکە پاشان پرسیاری لە خێزانی سێیەمینی کرد." لە هەموو ژیانم تۆم زۆر خۆش ویستووە. ئیستا خەریکە من دەمرم، ئایا لەگەڵم دێی و هاورێیەتیم دەکەی؟" خێزانی سێیەمین وەلآمی دایەوە:" نەخێر" " ژیان لێرە زۆر خۆشە ! کاتێ تۆ دەمریت من دووبارە شوو دەکەمەوە ! " دڵی بازرگانەکە نغرۆ و دڵ سارد بوو.

دواتر ئەو پرسیار لە خێزانی دووەمینی کرد " من هەمیشە بۆ یارمەتی ڕووم لە تۆ کرد و تۆش هەمیشە یارمەتیت داوم. ئیستا جارێکیتر پێویستم بەیارمەتی دانی تۆ هەیە. کاتێ من دەمرم، ئایا لەگەڵم دێی و هاورێیەتیم دەکەی؟" خێزانی دووەمینی وەلآمی دایەوە:" داوای لێ بووردن دەکەم، ئەم جارەیان ناتوانم یارمەتیت بدەم! " زۆرترین شت، من تەنها دەتوانم ڕەوانەی گۆڕستانەکەت بکەم." وەلآمەکە وەکو هەورەتریشقە وابوو و بازگانەکە وێران کرا.

پاشان دەنگێك هاواری کرد." من لەگەڵ تۆ دەڕۆم. من لەگەڵ تۆ دێم گرنگ نی یە بۆ هەر کوێ بچیت." بازرگانەکە سەیری کرد و خێزانی یەکەمینی بوو. ئەو زۆر لاواز بوو وەك بڵێی لە دەست بەد خۆراکی بناڵێنێت. بازرگانەکە بە خەفەتبارێکی زۆرەوە ووتی، " دەبوایە گرنگی باشترم پێدابای لە کاتێکدا دەمتوانی ! "

"I loved you most, endowed you with the finest clothing and showered great care over you. Now that I'm dying, will you follow me and keep me company?" "No way!" replied the 4th wife and she walked away without another word.
The answer cut like a sharp knife right into the merchant's heart. The sad merchant then asked the 3rd wife, "I have loved you so much for all my life. Now that I'm dying, will you follow me and keep me company?" "No!" replied the 3rd wife. "Life is so good over here! I'm going to remarry when you die!" The merchant's heart sank and turned cold.
He then asked the 2nd wife, "I always turned to you for help and you've always helped me out. Now I need your help again. When I die, will you follow me and keep me company?" "I'm sorry, I can't help you out this time!" replied the 2nd wife. "At the very most, I can only send you to your grave." The answer came like a bolt of thunder and the merchant was devastated.
Then a voice called out: "I'll leave with you. I'll follow you no matter where you go." The merchant looked up and there was his first wife. She was so skinny, almost like she suffered from malnutrition. The merchant said with great grief, "I should have taken much better care of you while I could have!"

*له ڕاستی دا، له ژیانماندا ئێمه چوار خێزانمان هه‌یه.*

١ـ خێزانی چواره‌مین جه‌ستمانه. گرنگ نی‌یه چه‌ند كات و كوشش ئێمه زیاد له پێویسته سه‌رف ده‌كه‌ین له جوانكردنی جه‌ستمان، كاتی ئێمه ده‌مرین به‌جێمان ده‌هێلێت.

٢ـ خێزانی سێیه‌مین مولك و پله‌و پایه و سه‌روه‌ت و سامانمانه، كاتێ ئێمه ده‌مرین، هه‌موو بۆ كه‌سانی تر ده‌ڕوات.

٣ـ خێزانی دووه‌مین خێزان و براده‌ره‌كانمانه. گرنگ نی یه چه‌ند لێمان نزیك بوونه كاتێ ئێمه زیندووین، ئه‌وان تا ئه‌و ڕاده‌یه ده‌توانن تا گۆڕه‌كه‌مان له‌گه‌ڵماندا بمێنه‌وه.

٤ـ له ڕاستیدا خێزانی یه‌كه‌مین ڕوحمانه، گه‌لێك جار له‌به‌ر گرنگی پێدان به مادده، سه‌روه‌ت و سامان و له‌زه‌ت فه‌رامۆشمان كرد.

بزانه چی یه؟ به‌ڕاستی ئه‌وه تاكه شته له‌گه‌ڵمان بێت كه بۆ هه‌ر شوێنێ برۆین. ڕه‌نگه بیرۆكه‌یه‌كی چاك و باش بێت تاوه‌كو گه‌ش و به‌هێزی بكه‌ین نه‌وه‌كو چاوه‌ڕێی بكه‌ین تا سه‌ره‌مه‌رگی مردن په‌شیمان ببینه‌وه.

Actually, we all have 4 wives in our lives
a. The 4th wife is our body. No matter how much time and effort we lavish in making it look good, it'll leave us when we die.
b. Our 3rd wife ? Our possessions, status and wealth. When we die, they all go to others.
c. The 2nd wife is our family and friends. No matter how close they had been there for us when we're alive, the furthest they can stay by us is up to the grave.
d. The 1st wife is in fact our soul, often neglected in our pursuit of material, wealth and sensual pleasure. Guess what? It is actually the only thing that follows us
wherever we go. Perhaps it's a good idea to cultivate and strengthen it now rather than to wait until we're on our deathbed to lament.

# هەڵۆ لەناو گەردەلولدا

ئایا دەتزانی کە هەڵۆ دەزانێ کەی گەردەلول نزیک دەبێتەوە پێش ئەوەی گەردەلولەکە هەڵ بکات. هەڵۆکە بۆ خاڵێکی بەرز دەفڕێت و چاوەڕێی بایەکە دەکات تاوەکو بێت. کاتێ گەردەلولەکە هەڵ دەکات، هەڵۆکە باڵەکانی دەکاتەوە تاوەکو بایەکە هەڵی بگرێت و بەسەر گەردەلولەکە بەرزیی بکاتەوە. لەکاتێکدا گەردەلولەکە بە توندی بڵاوە دەکات، هەڵۆکە بە سەرەوەی گەردەلولەکە بەرز دەفڕێت.

هەڵۆکە لە گەردەلولەکە ڕاناکات. ئەو گەردەلولەکە بە شێوەیەکی سادە بەکاردەهێنێ تاوەکو بەرزتر هەڵی بگرێت. هەڵۆ بەسەر ئەو بایەدا بەرزدەبێتەوە کە گەردەلولەکە دەهێنێ.

کاتێ گەردەلولی ژیان بۆمان دێت - و هەموومان شارەزایی گەردەلولەکان دەبین - ئێمە دەتوانین خۆمان بە سەریاندا بەرز بکەینەوە بە دانانی مێشکەکان و باوەڕمان بە خوای گەورە. گەردەلولەکان نابێت بە سەرماندا زاڵ بن. ئێمە دەتوانین ڕێ بە هێزی خوای گەورە بدەین بۆ ئەوەی بەسەر گەردەلولەکان بەرزمان بکاتەوە.

خوای گەورە هێزی پێداوین تاوەکو بەسەر بایەکانی گەردەلولەکە سەرکەوین کە ناخۆشی و کارەسات و نائومێدی بۆ ژیانمان دەهێنێت. ئێمە دەتوانین بە سەر گەردەلولەکەدا بەرز بفڕین. لەیاد بێت، ئەوە بارگرانی ژیان نی یە کە بارمان گران دەکات، بەڵکو شێوەی مامەڵەکردنی ئێمەیە لەگەڵ یاندا.

# Eagles in a Storm

Did you know that an eagle knows when a storm is approaching long before it breaks?
The eagle will fly to some high spot and wait for the winds to come. When the storm hits, it sets its wings so that the wind will pick it up and lift it above the storm. While the storm rages below, the eagle is soaring above it.
The eagle does not escape the storm. It simply uses the storm to lift it higher. It rises on the winds that bring the storm.
When the storms of life come upon us - and all of us will experience them - we can rise above them by setting our minds and our belief toward God. The storms do not have to overcome us. We can allow God's power to lift us above them.
God enables us to ride the winds of the storm that bring sickness, tragedy, failure and disappointment in our lives. We can soar above the storm.
Remember, it is not the burdens of life that weigh us down, but it is how we handle them.

# پیرە پیاوێکی نەخۆش

لە کاتی تێپەڕین بەناو دەربەندی چیایەکدا، دەشتەکییەك بەڕێکەوت تووشی پیرە پیاوێك دەبێت، کە پیرە پیاوەکە کوێر بوو و وا دیاربوو تەواویی جەستەی تووشی هەموو جۆرە نەخۆشی یەك ببوو. ئەو دیاربوو کە پیرە پیاوەکە بەرەو فەوتان دەچوو تەنانەت ئەو ئیفلیجیش بوو بە بەردەوامی ناچار بوو بە دانیشتن بمێنێتەوە دەشتەکییەکە بە تەواویی توانی گوێی لە پیرە پیاوەکە بێت، دەیووت:" سوپاس بۆ تۆ خوایە، منت لە هەموو نەخۆشیەك پاراستووە کە زۆرێك لە نێو دروستکراوەکانت پێ تاقی دەکەیەوە بەڕاستی خوای گەورە منی بە باشتر زانیوە لە نێو هەموو ئەوانەی کە دروستی کردوون.

و دەشتەکییەکە بەسەرسوڕمانەوە هاواری کرد:" براکەم." تۆ لە چی سەلامەت بووی؟ سوێند بە خوای گەورە، وا هەست دەکەم تۆ تووشی هەموو جۆرە نەخۆشیەك بوویت.

پیرە پیاوەکە هەرکە سەری خۆی بەرز کردەوە ووتی." لێم دوورکەوە." ئایا هێشتا زمانم نییە کە دەتوانم یەکتاپەرستی خوای گەورەیی پێ دەربڕم و دەشتوانم هەموو ساتێ یادی ئەو بکەمەوە؟ ئایا هێشتا دڵم نییە کە دەتوانم خوای گەورە بناسم؟"

قسەکانی پیرە پیاوەکە بۆ دەشتەکییەکە بەسبوون کە بگەڕێتەوە و داوای لێ خۆش بوون لە خوای گەورە بکات لەبەر گوناحەکانی.

لە یاد بێت، هەمیشە یەکێکی تر هەیە کە زیاتر لە تۆ لەناو کێشە دایە.

# The Patient Old Man

When passing through a mountain pass, a Bedouin (villager) once came across an old man who was blind and who seemed to be afflicted with various ailments all over his body. It was clear that he was wasting away. He was even paralyzed constantly forced to remain in a seated position. The Bedouin could clearly hear him say, " All praise is for Allah, who has kept me safe from ailments with which He has tested many among his creations; and He has indeed preferred me over many among those that He created."

"My brother!" exclaimed the Bedouin." What have you been saved from? By Allah, I think that you have been afflicted with every single kind of ailments!"

"Go away from me," said the old man, as he raised his head." Do I not still have a tongue with which I can pronounce His oneness, and with which I can remember Him every single moment? And do I not still have a heart with which I can know Him?"

The words of the old man were enough for the Bedouin to repent to Allah for his sins and ask Him for forgiveness.

Remember, there is always someone else who is in more problem than you.

# کورێکی کوێر

کورێکی کوێر لەسەر پەیژەکانی بینایەك دانیشتبوو لەگەڵ کڵاوێك لەبەر پێیەکانیدا دانا ئەو دروشمێکی دانا کە دەیووت:" من کوێرم، تکایە یارمەتی ."

چەند پارەیەکی کەمی خوردە لە ناو کڵاوەکە بوو، پیاوێك بە لایدا ڕۆیشت. ئەو چەند پارەیەکی خوردەی لەناو گیرفانی دەرهێنا و خستیە ناو کڵاوەکە. پاشان ئەو دروشمەکەی هەڵگرت و سووڕاندی و هەندێ وشەی لەسەر نووسی ئەو دوورشمەکەی داناوە تاوەکو هەرکێ بەلایدا ڕۆیشت وشە نوێ یەکان ببینێ. هەر زوو کڵاوەکە خەریك بوو پڕبوو.

خەڵکێکی زۆر پارەی بە کورە کوێرەکە دەدا. ئەو پاش نیوەڕۆییە پیاوەکەی کە دوورشمەکەی گۆڕیی بوو هات تاوەکو بزانێ شتەکان چۆن دەڕوات کورەکە هەنگاوەکانی ناسیبەوە و پرسیاری لێکرد.

" ئایا تۆ ئەو کەسە بوویت کە ئەم بەیانی یە دوورشمەکەت گۆڕی؟"

ئایا تۆ چیت نووسی؟

پیاوەکە وتی:" من تەنها راستی یەکەم نووسی. من ووتم کە ئەوەی تۆ وتت بەڵام بە شێوازێکی جیاواز." ئەوەی ئەو نووسی بووی ئەوەبوو. ئەمڕۆ رۆژێکی خۆشە و بەڵام من ناتوانم ببینم."

# A Blind Boy

A blind boy sat on the steps of a building with a hat by his feet. He held up a sign which said: "I am blind, please help." There were only a few coins in the hat.
A man was walking by. He took a few coins from his pocket and dropped them into the fat. He then took the sign, turned it around, and wrote some words. He put the sign back so that everyone who walked by would see the new words.
Soon the hat began to fill up. A lot more people were giving money to the blind boy.
That afternoon the man who had changed the sign came to see how things were. The boy realized his footsteps and asked,'' Were you the one who changed my sign this morning? What did you write?
The man said," I only wrote the truth. I said what you said but in a different way.''
What he had written was: "Today is a beautiful day and I cannot see it."

ئایا تـۆ وا هەست دەكـەی كـە یەكـەمین درووشـم و دووەمـین درووشـم هەمان شتیان دەووت؟ بێ گومـان هـەردوو درووشـمـەكان بـە خـەڵكیان دەووت كە كوڕەكە كوێرە. بەڵام یەكەمین درووشم بە سادەیی دەیووت كە كوڕە كـوێرە. دووەمـین درووشـم بـە خـەڵكی دەووت كـە ئێـوە زۆر دڵخۆشن كە كوێر نین. ئایا ئێمە سەرسام نـەبین كـە دووەمـین درووشـم زۆر كاریگەرتر بوو.

Do you think the first sign and the second sign were saying the same thing?
Of course both signs told people the boy was blind. But the first sign simply said the boy was blind. The second sign told people they were so lucky that they were not blind. Shouldn't we be surprised that the second sign was more effective?

## سواڵکەرە لە خواترسەکە

ئەم ڕووداوەی خوارەوەی لە شاری (دەکا) کە دەکاتە پایتەختی بەنگلادیش، ڕوویدا. سواڵکەرێك لە شارەکە ڕاهاتبوو لەتەنیشت مزگەوتێك هەموو ڕۆژێکی هەینی لە دوای نوێژی جومعە سواڵی دەکرد. سواڵکردن بۆ ئەو ڕێگە پێدراو بوو لەبەر خراپی بارودۆخەکەی. سەرەڕای ئەمەش ئەو سواڵکەر بوو، لەماوەی ووتارەکە کە گوێی لە ووتارە ئایینەکان ڕادەگرت کە پێشکەش دەکران. یەکێك لە ووتارەکان لەبارەی گرنگی بەدەست هێنانی سەرمایە حەلال بوو. ئەو زانی کە دووعا لە ئەو خەلکانە قبوول نابێت کە سەرچاوەی سەرمایەکانیان حەرامە. ئەو یەکسەر بڕیاریدا تەنها پارە لەو کەسانە وەربگرێت کە دەیزانی سەرمایەکانیان حەلاڵە. لە دەرئەنجامدا داهاتی ڕۆژانەکانی کەمی کرد، بەلام پابەندی بڕیارەکەی بوو.

پاشان ئەو ڕۆژە هات کە سواڵکەرەکە مرد. هەرچەندە، ئەو وەك سواڵکەرێك ژیا، بەلام ڕێوورەسمی بە خاك سپاردنەکەی وەك هی پاشایەك وابوو. زۆربەی پیاو ماقوڵانی ناوچەکە ئامادەی ڕێووڕەسمی بە خاك سپاردنەکەی بوون چونکە ئەوان ئەو قوربانیە گەورەیان دەزانی کە ئەو ڕۆژانە ڕاهاتبوو دەیدا تاوەکو لەسەر فەرمانی خوای گەورە بەردەوام بێت.

خوێنەرە بەرێزەکان: هەروەها ئێمەش پێویستە بەدڵسۆزییەوە فەرمانەکانی خوای گەورە لە ژیانماندا جێبەجێبکەین بەبێ گوێ دان بە پلەوپایەی کۆمەلایەتیمان. بەم شێوەیە، خوای گەورە لەم دوونیایە و لە ڕۆژی قیامەتیش بەرزمان دەکاتەوە.

# The Righteous Beggar

The following incident took place in Dhaka which is the capital city of Bangladesh. There was a beggar in the city who used to beg beside a Masjid on Fridays after Jumah prayer. Begging was permissible for him due to his adverse condition. Though he was a beggar, he would pay attention to the sermons that were delivered during the Khutbah. One such sermons was about the importance of earning Halal income. He learnt that supplications (dua) will not be acceptable from those people whose incomes are from forbidden sources. He immediately decided to accept money from only those individuals that he knew had Halal income. His daily earnings decreased as a result but he was committed to his decision.

Then came a day when the beggar died. Even though he lived as a beggar, his funeral was like that of a king. Many dignitaries of the area attended his funeral because they commandment of the Almighty Allah.

Dear readers, we too should sincerely adopt the commandments of Allah in our lives regardless of our social status. In this way, Allah will elevate us in this world and in the hereafter.

# بۆ پێزانین

بۆ پێزانینی بەهای خوشكێك پرسیار لە یەكێك بكە كە خوشكی نی یە.

بۆ پێزانینی بەهای دە ساڵ پرسیار لە ژن و مێردێكی تازە بكە كە تەلاق دراون.

بۆ پێزانینی بەهای چوار ساڵ پرسیار لە دەرچوویێكی زانكۆ بكە.

بۆ پێزانینی بەهای یەك ساڵ پرسیار لە قوتابیەك بكە كە لە تاقی كردنەوەی كۆتایی ساڵ دەرنەچووە.

بۆ پێزانینی بەهای نۆ مانگ پرسیار لە دایكێك بكە منداڵەكەی بە مردوویی لە دایك بووە.

بۆ پێزانینی بەهای یەك مانگ پرسیار لە دایكیك بكە پێش وەختە منداڵێكی بووە.

# To Realize

The value of a sister
Ask someone
Who doesn't have one.

To realize
The value of ten years:
Ask a newly
Divorced couple.

To realize
The value of four years:
Ask a graduate.

To realize
The value of one year:
Ask a student who
Has failed a final exam.

To realize
The value of nine months:
Ask a mother who gave birth to a still born.

To realize
The value of one month:
Ask a mother
who has given birth to
A premature baby.

بۆ پێزانینی بەهای یەك هەفتە پرسیار لە نووسەری ڕۆژنامەیەكی هەفتانە بكە.

بۆ پێزانینی بەهای یەك خولەك پرسیار لە كەسێ بكە كە شەمەندەفەر یان پاس یاخود فرۆكەی لە دەستی چووە.

بۆ پێزانینی بەهای یەك چركە پرسیار لە كەسێ بكە لە ڕووداوێك ڕزگاری بووە.

بۆ پێزانینی بەهای ملی چركەیەك پرسیار لە كەسێ بكە كە مەدالیای زیویی بە دەست هێناوە.

كات چاوەڕێی كەس ناكات. هەموو ساتێك بنرخێنە كە هەتە.
بۆ پێزانینی بەهای یەك برادەر یەكێك لە دەست بدا.

To realize
The value of one week: Ask an editor of a weekly newspaper.

To realize
The value of one minute:
Ask a person
Who has missed the train, bus or plane.

To realize
The value of one-second:
Ask a person
Who has survived an accident...

To realize
The value of one millisecond:
Ask the person who has won a silver medal in the Olympics

Time waits for no one.
Treasure every moment you have.
You will treasure it even more when
you can share it with someone special.
To realize the value of a friend:
Lose one.

وەرگێڕانی:

محەمەد موسا ئیبراهیم

*Translated by:*
*Mohammad Musa Ibrahim*

سەرچاوەی چیرۆکەکان ئینتەرنێتە

کۆتایی

**THE END**